زنجیرەی بیرۆکەکانی قوربانی پیرۆز

ئەلقەی یەکەم

# ئادەم پێغەمبەر

درودی خوای لەسەربی

صلاح محمد امین بهاءالدین

چاپخانەی
دار الرسالة - بغداد
سالی ١٩٨٠

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

بەناوی خـواوە ، سوپاس بۆ خوا ، درود و ستایش بۆ پێغەمبەری پێشەوا ..

قورئانی پیرۆز ، کـە خەزێنەیەکی زێڕین و گەنجێکی گەوهەرین بێ ، بۆچی پەنا بۆ پروپیەژنو کولێنانیو فالچی ودەست برەکان ببەین ؟ ! چونکە ئەبێ بیربکەینەوە ... ئایا کێ دروستی کردوین و کێ سەرپەرشتیمان ئەکاو کێ ڕۆزیمان پێ ئەبەخشێو کێ بیروهۆشو فامی پێ خەلات کردوینو کێ نەخۆشمان ئەخاو کێ ئەمان مرینێو بەتەمای دادو میهرەبانی کێین ؟! بێگومان خوای پەروەردگار ..

وە هەر ئەو خوایەش ئەتوانێ تیماری دەردەکانمان

بکاتو تەنها پەیامو پێغەمبەرەکانی ئەو ئەتوانن
مەشخەڵی چارەسەری‌و تیماری کۆمەڵی شەکەت‌و
شکستەی دەستی دوور لە خواییمان بکات .. هەر
بەرنامەی خوا توانای سود بەخشی‌و چارەسەری
ئێمەو گشت مرۆڤەکانی هەیە . چونکە تەنها خوا
دروستی کردوین و هەر ئەویش ئەزانێ چیمانەو
بەچی چارەسەر ئەکرێین ؟! بۆیە قورئان خاوەنی
خوێندنگایەکی واچارەسەرکەرو حەکیمانەی
بزورگە کە توانی کۆمەڵگەی بێدەرەنگ‌و دڕندە
سروشتی ئەو کاتەی نیوەدورگەی عەرەب بکاتە
نموونەی خاوێن‌و بەختیارترین کۆمەڵگەو بیکاتە
پێشڕەوی کاروانی خێرو چاکە لە دنیادا ،
شارستانیەتێکیان لە پەنای قورئاندار بە هۆی
قورئانەوە بنیات‌نا کە ئەوە چوارده سەدەیە هێشتا
بلیسەی گڕی شۆڕشەکەی هەر لەگەڵ گەشکەشانی
ئاسمان چەپڕکانیەتی ..

جا بۆیە ' وە لەم ڕوانگەوە حـــەز ئەكەم بفەرمووی ـ خوێنەری بەڕێز ـ كە سەرێك لە خەزینەی پڕ تفاق و كۆگای ڕازاوەی پڕ كـەمالی قورئانی پیرۆز بدەین بۆ تیماری دەردەداریمان و چارەی بەد ئەحوالیمان .

بەڵام لە بەر ئەم سەهۆڵی بەندانە ناهەموارەی كە دنیای گرتۆتەوەو تەنانەت مێشك و هۆشەكانیش بەستویانە ، بەرەو قوڵێك بچین كە لەگەل تەمەنی بیرو هۆشماندا و لەگەل ڕۆژی بانگەوازەكەی قورئاندا بگونجێ ، چیرۆكەكانی قورئانی پیرۆز بە باشترین پەنا ئەزانم بۆ ئەو مەبەستە .. هـــەم چیرۆك و زستان بەینیان خۆشەو هەم مەبەستی ئێمە كە بەهرەوەر بـــوونە لە خزمەت فەرمایشتە زێڕینەكانی پەروەردگاردا دێتە دی .

لە بەختی ئێمەشدا وا خێزانە بەختیارەكەی مامۆستا ڕەحیم خەریكی گێڕانەوەی ئەو چیرۆكـە

پەڕۆرانەن لە کۆڕێکی چیرۆك خوانی شەوانەدا کە
لە قالبێکی شانۆکەری ئەشەنگدا هەر چیرۆکەی
بەچەند دانیشتنێك تەواو ئەکەن و دوا شەویشیان
دائەنێن بۆ شی کردنەوەی خاڵە گرنگەکانی
چیرۆکەکان و گوڵچن کردنی پەندەکانیان .

دە فەرموون خوشك و برای شیرین با فریای
چیرۆکی یەکەمی زنجیرە چیرۆکەکان بکەوین کە
سەرگوزەشتەی دروست بوونی یەکەم مرۆڤ و
جێ نشینیەتی ئادەمیزادو دوژمنایەتی شەیتان و
زەفەربردنەکانی شەیتان بە باوکە ئادەم و خێزانەکەی
و رۆڵەکانی ئەگێڕێتەوە .. لە خوا ئەخوازم کە
بەرەزامەندیەوە ئەم بەرهەمە کاڵ و کرچەش لە ئێمە
قبول بکاو لە قورئانی پیرۆز بەهرەوەرمان بکاو
کۆمەکمان بکا بۆ تۆمارکردنی ئەڵقە داهاتووەکانی
ئەم زنجیرە پیرۆزە ...

صلاح الدين

محرم / ١٣٩٤ شباط / ١٩٧٤

# خێزانی ماموستا عبدالرحیم

ماموستارەحیم : ماموستایەکە لە یەکێ لـە خوێندنگاکانی کوردستان .

فاطمەخان : دایکی منالەکانی ماموستایەو سووکە خوێنەواریەکی هەیەو بە جوانی یارمەتی ئەدا لە بەرێوە بردنی ئەرکی ماڵداریو لێ پرسراوە لە پەروەردەی منالو سەروکاری ماڵدا .

ئوسامە : کوڕی گەورەی ماموستایە ، قوتابی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی یە .

حەمزە : کوڕی بچوکی ماموستایە ، قوتابی پۆلی سێهەمی ناوەندی یە ..

قەسیدە : تاقە کچی مامۆستایەو لە پۆلی یەکەمی
ناوەندی‌یە ، شایانی باسیشە کە بە جوانی ئادابی
شەرمەی ئافرەتی موسڵمان ڕادەگرێت ، هەرچەندە
هاوڕێکانی تانەی لێ ئەدەن ...



بسم الله الرحمن الرحيم

﴿٢٩﴾ وَإِذْ قَالَ
رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓا أَتَجْعَلُ فِيهَا
مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ
لَكَ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ
عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ
ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم
بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ
مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾

— ١ —

[زستانەکەی زۆر سەختو پڕ لە سەرماو سزڵەیە ، دەرو دەشتو کێو تارای سپی بەفرینی پۆشیوە ، بەڵام ماڵی « مامۆستا رەحیم » چ بـاکیانە کـە چزلەکەو مارو مێروو وبێنەوایان بەدەست سەرماوە زیلو یەمیانە ، چونکە زۆپاکەی ئەوان هەمیشە تاو بوو .. هەر کە شەو دائەهات خێزانەکەی مامۆستا بە دەور و بەری زۆپاکەدا کرد ئەبوونەوەو گوێیان لە چیرۆکە خنجیلانەکانی مامۆستا ئەگرت . . بە شێوەیەك کە زۆرتر لە کۆڕێکی ئەدەبی ئەچوو نەك خێزانێکی کوێستان نشین .

ئەمشەو « ئوسامە »ی کوڕی داوای گێڕانەوەی چیرۆکێکی زۆر گرنگو پیوبـق کـرد . . ئەو چیرۆکەی کە دەمێکە چـاوەڕێی نۆرەیەتی . . چیرۆکی دروست بوونی یەکەم مرۆڤ ....

سەرگوزەشتەی ئادەم پێغەمبەر ـ درودی خوای

لەسەربێ - ] .
ئوسامە : بابە گیان ئەمشەو نۆرەی چیرۆکی باوکە
گەورەمانە ، ئادەم پێغەمبەر - درودی خوای لەسەربێ
- چونکە بەڕاستی زۆر باسێکی گرنگو پێویستە ..
خـــێزان : ( بەتێکڕا ) ئەری بە خوا باسێکی
پێویستو خوشە ..
مامۆستا رەحیم : ڕۆڵە گیان جۆیشم ولم نیازە ..
چـونکە بەڕاستی ئەم سەرماو سۆڵەیە کە ئەم
جیهانەی داگرتۆتەوە ناچارمان ئـ ـەکا لاشەمـان
بەم زۆپایە گـــەرم کەینەوەو گیانو هەستیشمان
زۆپایەکی بۆ تاوکەین .. لە ســـەرگوزەشتەی
پێغەمبەرانیش خــۆشترو گەرمو نەرمتر چنـک
ناکەوێ . . هـەم لە سەرمای ئەم زستانە
ڕزگارمان ئەبێو هـەم هێزو تواناو وزەی
ڕامالینی بەفرو تەرزەی ڕێگامان دەست ئەکەوێ ..
چونکە پیاو ڕێگای سەختو دوری لەڕێدا

بوو ئەبێ خـۆی گـەرم کاتەوەو چاك تفاقی سەفەر
بپێچێتەوە . . بڕیار بێ ئەم چلەی زستانە بـە
رەفیقی ئەم زورپایەو چیرۆك خوانی چیرۆکەکانی
قورئانی پیرۆز بەرینە سەر . .

بەلأم پێشەکی پێتان رائەگەیەنم ئەوەی کـە
لە قورئاندا ئەبێ بۆتانی نەگێرمەوە ، چونکە
تەنها قورئانو چیرۆکی قورئانە توانای گـەرم
کردنەوەی ئیمەی ڕێبواری هـەیە ، بەلأم
قـەرزارم بێ ئەگـەر لە گێرانەوەی ئـەم
چیرۆکانە درێغی بکەن لای ئەوانەی کە
کەلکی لێ وەر ئەگرنو خەساری ناکەن . .

[ چاوو گوێی هەموو خێزانەکە ئاراستەی
دەمو زمانە پاراوەکەی مامۆستا بوو بوو ،
هـەمـوو گوێ قـولاخ وەستابوون بـە
دیاریەوە تا لەخەزێنەی بیرو هۆشە تیژەکەی
بەشیان بـدا . . تا لە کۆزکاوی دنیـا دیـدەیی و

دیندارییەکەی بەهرەوەریان بکا . . لە
ئاکاو قەڵەمەکەی فڕێ داو لێی هاتە
سەر چۆکو ڕووی کردە دایکی ئوسامة ] .

**مامۆستا رەحیم** : بەو شەرتەمان کردبێ تا ئەم
چیرۆکە تەواو ئەبێ قۆری چایەکەی تۆ لەسەر
ئاگرەکە دانەگیرێو پیالەکەی منیش لەبەر
دەمما هەڵنەگیرێ ... ڕۆڵەکانم ، خێزانە
بەختیارەکەم گوێم بۆ بگرن :

کاتێك کە خوای پەروەردگار زەوی‌و ئاسمانی
دروست کرد بۆ پەرستش‌و فەرمانبەری‌و
هەڵسوڕاندنی ئیش‌و کاری خۆی ، ویستی
جێنشینێکی بەهرەمەندو کارگوزار بخاتە
سەر ئەم زەویە بۆ ئاوەدان کردنەوەی‌و ژێر
بارخستنی ئەم بوونەوەرە ( کَوْن ) ، تەنها بۆ
ئەوەی گەورەیی خوا ئاشکرا بێ‌و خواناسی
تیابکرێ ..

خوا ئەفەرموێ ڕووبەڕووی فریشتەکان :

« من ئەمەوێ خەلیفەو جێنشینێك لە زەویدا دابنێم » فریشتەکان سەرسام بوونو کوتو پڕ وتیان :

« ئایا تۆ کەسێك دائەنێی بە جێگەدار کە خراپە بکاو خوێن ڕێژ بێ ، کەچی ئێمە دائیمە هەمیشە فەرمانبەرو مل کەچین ؟! » .

خوای، پەروەردگاریش پێی فەرموێ :

« ئەوەی من ئەیزانم ئێوە نایزانن .. »

ئینجا خوای گەورە لە قوڕ ئادەمی دروست کرد وە لە گیانی خۆی ، گیانو ژیانی پێ بەخشی ، وە کردی بەو جێنشینەی کە پێشتر هەولی دا بە فریشتەکان .. وە فێری ناوی هەموو شتێکی ئەم زەویەی کرد . .

وە بۆ ئەوەی بۆ فریشتەکانی ڕوون بکاتەوە کە ئادەم شایستەی ئەو فرمانەیەو شیاوی ئەوەیە

کەچی نەیێنی خواو سەرداریەتی بونەوەر بکا . .
بۆ ئەم مەبەستە چەند جۆرە شتێکی خستە بەر
چاویان وە پێی فەرمون :
« ئادەی فریشتەکان ناوی ئەم شتانەم پێ
بڵێن » . .
فریشتەکانیش بە حەپەساویەوە وتیان :
« خوایە ئیمە هیچ نازانین جگە لەوەندە نەبێ
کە خۆت فێرت کردوین . . هەر خۆت هەموو
شتێ ئەزانی » .
ئینجا خوا فەرموی بە ئادەم :
« ئادەی تۆ ناوەکانیان پێ بڵێ » . .
ئەویش بە ئاسانی ناوەکانی پێ وتن . . بێ
گومان لێرەدا زانایی‌و لێهاتوویی‌و شایستەی ئادەم
دەر ئەکەوێت .
ئینجا خوا فەرموی بەفریشتەکان :
« ئەوەتە من پێم نەوتن باشتر ئەزانم‌و

ئاکام لە هەموو شتێکە ؟! » (١)

حەمزە : بابە گیان حەز ئەکەم بۆمان ڕون بکەیتەوە کە چۆن بلوکە ئادەم لە قوڕ دروست کراوە چونکە بەڕاستی لەشی مرۆڤ زۆر دوورە لە گڵو قوڕەوە ئەگەر بە سەر زارەکی سەیر بکرێ .

مامۆستا : ڕاستە بە سەر زارەکی سەیر بکرێ لەشی مرۆڤ زۆر دوورە لە گڵو خاکو قوڕەوە .. بەڵام مەسەلەی دروست بونی یەکەم مرۆڤ لە قوڕ شتێکی سەلمێنراوە چ بەفەرمودەی خوا (٢) وە

(١) لە سورەتی « البقرة / ٣٠ _ ٣٣ » .

(٢) لە سورەتی « السجدة »

ذلك عالم

الغيب والشهادة العزيز الرحيم ۞ الذي أحسن كل شيء خلقه وبدأ خلق الإنسان من طين ۞ ثم جعل نسله من سلالة من ماء مهين ۞ ثم سواه ونفخ فيه من روحه

چ بەزانیاریو لێکۆڵینەوەی کیمیایی .. زانایان ئیسپاتی ئەوەیان کردوە کە ئەگەر مشتێك خۆڵی ئەم زەمینە بهێنیو لیکۆڵینەوەو شی کردنەوەی کیمیاوی بەسەردا بکەی لە ئەنجاما بۆت دەرئەکەوی کە «١٦» عونسری تیایە .. وە هەروەها پارچەیەك لە لەشی مرۆڤ بهێنی وە بیخەیتە ژێر لێکۆڵینەوەی کیمیاویەوە ئەبینی هەمان شێوە بریتیە لەو «١٦» (عنصرە : توخم) کە ئەمانەن :

ئۆکسجین ـ کاربۆن ـ هایدرۆجین ـ نایترۆجین کالسیوم ـ فوسفۆر ـ کلۆر ـ گۆگرد ـ پۆتاسیوم ـ سۆدیوم ـ مەگنیسیوم ـ ئاسن ـ یۆد ـ سلیکۆن مەنگەنیز .. (١)

ئەسیبە : باشە ئەو شتانە ـ عناصر ـ ی دروست

(١) لە کتێبی « ئادەم » دانراوی مامۆستا « بەهی الخولی » وەرگیراوە ..

بونی لەشی ئادەمیزادن ، ئەی‌کیان ـ روح ـ چیە؟
مامۆستا : بەراستی تائێستا کەسێك لەبارەی رۆحەوە هیــچ نازانێ . کەچی هەیشە ! ئەوەتە زەلامێك تەنها ئەو کیانەی لێ دەرئەچێ ، ئیتر لەشی ساغو سەلیمە کەچی بە مردوو حیسابەو دوای ماوەیەك ئەو لەشە ناســكو ئازایەی ئەوســای ئەرزێو ئەبێتەوە بەخاك . .

هەمان پرسیار لە کاتی خۆیا کرا لە پێغەمبەری پێشەوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ . . وەلامەکەی نەزانیو وەستا بە دیار ئاکادار کردنی خواوە ، پاش ماوەیەك وەلامەکەی بەم ئایەتە‌بوو :

« وَيَسْئَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِنَ العلم إلا قليلا » . . [ الاسراء / ٨٥ ] .

واتە : وە لێت ئەپرسن کە . . کیان » چیە؟

بلێ : کیان نهێنیەکی خواییەو ئێوە ئەوەنـدە ئاکاداریتان نەدراوەتێ کە پەی بەو شتانە بەن ..

جا لە ڕاستیدا کەورەیی و گرنگی ئادەمیزاد لەو خەڵاتە خواییەوەیە ، واتە ( روح ) . ئە کینا کاتێك کە ئەو خەڵاتەی لێ سەندرایەوە ـ واتە مرد ـ بە پەلە ئەبێ بخرێتە ناوخاکەوە یا سەر ئوکم بکرێ ئەگینا بۆکەن ئەکاو ژیان لە عالەم تێك ئەدا . .

ئینجا ئەبێ بزانین ئەهێنی ئەو سەرداری و مەزنیەی کە مرۆڤ هەیەتی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوگیانە کە مەگەر خـــوا بزانێ چیە ، ئەوەنـدە هەیە ( دیاریەکی ) خوایی‌یەو لە خودی زاتی خۆیەوە بەخشراوە بەو پارچـە قوڕەی کە خـوا کردویەتی بە سـەرداری سەرزەوی وجێ‌نشینی خۆی . (١)

ئوسامە : بابە پرسیارێك ، ئایا بۆچی فریشتەکان

---

(١) « وَنَفَخْتُ فِيهِ من روحي » [ الحجر ] ٢٩ .

ئەو ناوانەیان نەزانیو باوکە ئادەم زانی .. ؟ !

مامۆستا : ڕۆڵە گیان ئەوە لەبەر ئەوە بوو کە

ئەو شتانە گشت پەیوەندی بە ژیانی ئادەمەوە هەبوو وە ناوی زانیبون لە کاتی پێشوودا.. چونکە ئەو شتانە گشت کەرەسەی فرمانەکەی بوون ، وە ئەبوایە ژێر باریان بخاو سوودیان لێ وەربگرێ ..

بەڵام فریشتەکان هیچ پەیوەندیەکیان بەو شتانەوە نەبوو ، وە هیچ ئیشێکیان بەشتو مەکی سەر زەوی‌و ئاسمان نیە . بەڵکو تەنها ئیشیان پەرستش‌و فەرمانبەری خوای میهرەبانە ، نە وچان ئەدەن وە نە خواردن ونارەزویان هەیە .. جگە لە مانەش خوای میهرەبان ئەیویست بەم نموونەیە گەورەیی‌و لێهاتوویی ئادەم بە فریشتەکان بسەلمێنێ ..

تا ئێرە ئەمشەو بەسە ، خوا کۆمەك بێ سبەی شەو هاڵاوێکی تر لە کووری گەرمو گوڕی

سەرگوزەشتەی ئادەم پێغەمبەر - درودی خوای لەسەربێ - وەرئەگرین ..

# بسم الله الرحمن الرحيم

وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟
إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ
أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾
قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ
مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ
ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾
ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ
وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا
لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ

[ الأعراف ]

[ بەم بارانو تۆفە مامۆســتا نەیئەتوانی بچێ بۆ مزگەوت ، هەر لە پەنازۆپاکەدا نوێژەکەی خەوتنانی کردو شانی دادا ، ئینجا قورکی لێ ســاف کردو بانگی کردە « ئوسامە » و « حەمزە » و « نەسیبە » وە « فاطمەخان » ی دایکان .. هەموویان لەزۆپاکە کۆمەڵیـان کردو لەوەدا بوو مامۆستا قسە بکا ، بەڵام نەسیبە لێی هاتە پێشەو وەك یەکێك مەراقی قسەیەکی بێ ... ]

نەسیبە : ئەرێ بابە دوێ شەو باسی ئەوەت کرد کە خوای پەروەردگار ئادەمی کردوە بە جێنشینی خۆی بۆ سەرداریەتی و ئاوەدان کردنەوەی زەوی .. بەڵام من لەوە حالی نەبوم کە ئایا حەزرەتی ئادەم بێ باوکو دایك لە کێ بووە ئایا چۆن لەقوڕ دروست بوە ؟

مامۆستا : زۆر جوانە رۆڵە گیان ، ئەبوایە

ئەوەمان لەیاد نەچوایە کە خـوای پەروەردگار
بە فریشتەکان ئەفەرموێ من مرۆڤم دروست کردوە
لە قوڕ جا کە گیانم کرد بە بەریا ئێوەش کڕنوش
ڕێزی بۆ ببەن . مـانای وایە باوكو دایکی نەبوە
وە لەقوڕی سووردوە کراو دروست بوەو خوا گیانی
کردوە بە بەریا .. وە ئێستاش زانیاری دەری خستوە
کە لەشی ئادەمـیزاد لە قوڕ دروست بوەو گیـانی
کراوە بە بەرا ـ هەروەك باسمـان کرد ـ وە پاش
مردنیش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو شتانە ، وە لای خوایش
هیچ شتێ کرنك نەکونجاو نیە ..

ئوسـامە : باشە بابە گیان ، ئەوا زانیمان کە
ئادەم لە قوڕ دروست بوەو گیانی کراوە بە بەرا ،
وە هەر چەند ئەمە دوورە لە پێش چاوی ئێمە بەلام
لای خوا ئاسانەو هیچ دوورنیە .. بەلام من ئەوەم لا
سەیرە کە چۆن خوا ئەمر ئەکا بە فریشتەکان سوجدە

بیەن بۆ ئادەم ؟ چونکە ناکونجێ خوا فەرمان بکا
بە سوجدە بردن بۆ غەیری خۆی ..
مامۆستا : ئەمیش جوانو ڕاستە . بەڵام سوجدە
دووجۆری هەیە : سوجدەی پەرستن کە بۆ غەیری
خوا نابرێ ، وە سوجدەی ڕێز لێ کرتنو پێشوازی ،
کە ئەم جۆرەی ئاخریانە خوا فەرمانی پێ کردوە
لەم حاڵەتەدا .. بەم جۆرە خوای میهرەبان فەرمانی
کردبە سوجدە بردنی کۆمەڵ فریشتەکان بۆ حەزرەتی
ئادەم ، بێ کومـان کشتیان فەرمان بەریان کردو
کوێ ڕایەڵییان کرد جکە لەو یەکەیان ئەبێ کە ناوی
« ئیبلیسە » فیزو ئەکبەتی کرتیو سوجدەی نەبرد ..
بێ کومان شتێکی سەیر بوو کە بەندە سەرپێچی
فەرمانی خـوا بکاو فـیز بیکرێ ، بۆیە خواوەنـد
فەرموی :

« بۆچی سوجدەت نەبرد ئەی ئیبلیس ؟ »

شەیتانیش ووتی : چونکە من لەو باشترم ، ئەوت لە قوڕ دروست کردووەو من لە ئاگر ...

خوای گەورە خەشمو قینی لێ گرتو لە بەهەشتە دەری کرد ، لە سەر ئەوبێ ئەدەبیو فیزو لەخۆ بایی بونەی .. فەرموی :

« لە عنەتت لێبێ تا ڕۆژی دوایی » .

شەیتانیش وتی : خوایە مۆڵەتم بدەو بمهێڵەرەوە تا ڕۆژی سزاو پاداشت ..

خـوای میهرەبانیش مۆڵەتی داو وێڵی کـرد . ئینجا ئەویش لە داخانا سوێنی خوارد کە دەست بکاتە کومڕا کـردنو هەل خەلەتاندنی ئادەمو نەوەکانیولە خشتەیـان بەرێو ڕێی ڕاستیـان لێ بگرێو لە هەموو لایەکەوە هێرش بکاتە سـەر دلەکانیانو وێڵیان بکات مادام ئەو بوو بە مایەی سەر کەردانیو ماڵ کاول بونی ..

خوایش فەرموی : چیمت لە دەست دێ دریغی نەکەی ، چونکە فێڵو تەڵەکەو تەکبیری تۆ ناتوانێ موسلمانی ڕاستە قینە لە ڕێ دەرکاو گومڕای بکا .. بەڵام ئەوانەی کە بە قسەت ئەکەنو شوێنت ئەکەونو شاگردیت ئەکەن ، ئەوانە وەك تۆ دوورن لە ڕەحمی خواوەو جێگایان هەر دۆزەخە .

[ لە گەرمەی ئەم باسەدا بوون « مام أحمد » ی دراوسێیان بەدەنگە زوڵاڵەکەیەوە هاواری کرد ]

مام‌أحمد : ئەوە نە نوستوون ؟ !

[ ئینجا خۆی کرد بە ژوورا بێ پرس وەلاوە خواستن ، بۆ هەڵڕشتنی ئەو دعایەو پروپاگاندەو هەواڵە درۆیانەی کە بەدرێژایی ئەو ڕۆژە پەیدای کردبون .. ناچار مامۆستای زیرەك کۆتایی هێنا بە دانیشتنەکەیانو بە خێزانەکەی ڕاکەیاند کە تازە مەگەر سبەی شەو نۆرەی باسەکەیان بێتەوە ] .

# بسم الله الرحمن الرحيم

وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ
شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا
ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ
عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن
رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾

[ البقرة ]

# بسم الله الرحمن الرحيم

وَيَا آدَمُ
اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا
هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ
لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْآتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ
الشَّجَرَةِ إِلَّا أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَا
إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ
بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ
وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ
الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ
لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ

[ الأعراف ]

[ بەم باران‌و تۆفە مامۆســـتا نەیئەتوانی بچێ بۆ مزگەوت ، هەر لە پەنازۆپاکەدا نوێژەکەی خەوتنانی کردو شانی دادا ، ئینجا تووکی لێ سـاف کردو بانگی کردە « ئوسامە » و « حەمزە » و « نەسیبە » وە « فاطمەخان » ی دایکان .. هەموویان لەزۆپاکە کۆمەلیـان کردو لەوەدا بوو مامۆستا قسە بکا ، بەلاّم نەسیبە لێی هاتە پێش‌و وەك یەکێك مەراقی قسەیەکی بێ ... ]

نەسیبە : ئەرێ بابە دوێ شەو باسی ئەوەت کرد کە خوای پەروەردگار ئادەمی کردوە بە جێ‌نشینی خۆی بۆ سەرداریەتی‌و ئاوەدان کردنەوەی زەوی .. بەلاّم‌من لەوە حالی نەبوم کە ئایا حەزرەتی ئادەم بێ باوك‌و دایك لە کێ بووە ئایا چۆن لەگور دروست بوە ؟

مامۆســتا : زۆر جـوانە رۆلە گیان ، ئەبوایە

ئەوەمان لەیاد نەچوایە کە خـوای پەروەردگار
بە فریشتەکان ئەفەرموێ من مرۆڤم دروست کردوە
لە قوڕ جا کە گیانم کرد بە بەریا ئێوەش کڕنوشی
ڕێزی بۆ ببەن . مـانای وایە باوکو دایکی ئەبوە
وە لەقوڕی سووردەوە کراو دروست بوەو خوا گیانی
کردوە بە بەریا .. وە ئێستاش زانیاری دەری خستوە
کە لەشی ئادەمـیزاد لە قوڕ دروست بوەو گیـانی
کراوە بە بەرا ـ هەروەك ئاسمـان کرد ـ وە پاش
مردنیش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو شتانە ، وە لای خوایش
هیچ شتێ گرنگ و نەگونجاو نیە ..

ئوسـامە : باشە بابە گیان ، ئەوا زانیمان کە
ئادەم لە قوڕ دروست بوەو گیانی کراوە بە بەرا ،
وە هەر چەند ئەمە دوورە لە پێش چاوی ئێمە بەڵام
لای خوا ئاسانەو هیچ دوورنیە .. بەڵام من ئەوەم لا
سەیرە کە چۆن خوا ئەمر ئەکا بە فریشتەکان سوجدە

بیەن بۆ ئادەم ؟ چونکە ناگونجێ خوا فەرمان بکا
بە سوجدە بردن بۆ غەیری خۆی ..
مامۆستا : ئەمیش جوانو راستە ، بەڵام سوجدە
دووجۆری هەیە : سوجدەی پەرستن کە بۆ غەیری
خوا نابرێ ، وە سوجدەی ڕێز لێ گرتنو پێشوازی ،
کە ئەم جۆرەی ئاخریانە خوا فەرمانی پێ کردوە
لەم حاڵەتەدا .. بەم جۆرە خوای میهرەبان فەرمانی
کردبە سوجدە بردنی گشت فریشتەکان بۆ حەزرەتی
ئادەم ، بێ گومـان کشتیان فەرمان بەرییان کردو
گوێ رایەڵییان کرد جگە لەو یەکەیان نەبێ کە ناوی
« ئیبلیسە » فیزو نەگبەتی گرتیو سوجدەی نەبرد ..
بێ گومان شتێکی سەیر بوو کە بەندە سەرپێچی
فەرمانی خـوا بکاو فـیز بیگرێ ، بۆیە خواوەنـد
فەرموی :

« بۆچی سوجدەت نەبرد ئەی ئیبلیس ؟ »

شەیتانیش ووتی : چونکە من لەو باشترم ، ئەوت لە ئور دروست کردووەو من لە ئاگر ...

خوای گەورە خەشم و قینی لێ گرت و لە بەهەشتە دەری کرد ، لە سەر ئەوبێ ئەدەبی و فیزو لەخۆ بایی بونەی .. فەرموی :

« لە عنەتت لێ بێ تا ڕۆژی دوایی » .

شەیتانیش وتی : خوایە مۆڵەتم بدەو بمهێڵەرەوە تا ڕۆژی سزاو پاداشت ..

خوای میهرەبانیش مۆڵەتی داو ویلی کرد . ئینجا ئەویش لە داخانا سوێنی خوارد کە دەست بکاتە کومرا کردن و هەل خەڵەتاندنی ئادەم و نەوەکانی و لە خشتەیان بەرێ و ڕێی ڕاستیان لێ بگرێ و لە هەموو لایەکەوە هێرش بکاتە سەر دڵەکانیان و ویلیان بکات مادام ئەو بوو بە مایەی سەر گەردانی و مال کاول بونی ..

خوایش فەرموی : چیت لە دەست دێ دریغی نەکەی ، چونکە فێڵو تەڵەکەو تەکبیری تۆ ناتوانێ موسلمانی ڕاستە قینە لە ڕێ دەرکاو گومرای بکا ..

بەڵام ئەوانەی کە بە قسەت ئەکەنو شوێنت ئەکەونو شاگردیت ئەکەن ، ئەوانە وەك تۆ دوورن لە ڕەحمی خواوەو جێگایان هەر دۆزەخە .

[ لە گەرمەی ئەم باسەدا بوون « مام أحمد » ی دراوسێیان بەدەنگە زوڵاڵەکەیەوە هاواری کرد ]

مام أحمد : ئەوە نە نوستوون ؟ !

[ ئینجا خۆی کرد بە ژوورا بێ پرس وەساوە خواستن ، بۆ هەڵرشتنی ئەو دعایەو پروپاگاندەو هەواڵە درۆیانەی کە بە درێژایی ئەو ڕۆژە پەیدای کردبون .. ناچار مامۆستای زیرەك کۆتایی هێنا بە دانیشتنە کەیانو بە خێزانەکەی ڕاگەیاند کە تازە هەگەر سبەی شەو نۆرەی باسەکەیان بێتەوە ] .

# بسم الله الرحمن الرحيم

وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ
شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا
ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ
عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن
رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾

[ البقرة ]

# بسم الله الرحمن الرحيم

وَيَـٰٓـَٔادَمُ

ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا
هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ لِيُبْدِىَ
لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـٰذِهِ
ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَـٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ
إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ
بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ
وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ
ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ
لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ :

[ الأعراف ]

[ ئەمشەو ماڵی مامۆستا رەحیم هەریەکە خەریکی شتێکن ، ئەوەی لە بیریان چووبێتەوە هەر کۆنکردەو کۆرە چیرۆك خوانیەکەی مامۆستا بوو .. تا ئوسامەو حەمزە نوێژی خەوتنانیان لە مزگەوت بە جەماعەت کردو بە شێنەیی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە ، سەیر ئەکەن لەوە ناچێ باوکیان چیرۆکەکەی لە یاد بێ ، ئەوانیش خۆیان بێدەنك کرد تابزانن کەی چەرەسی کردنەوەی کۆڕەکە ئێ ئەدا .. دەنك نەبوو تا ( فاطمەخان )ی دایکیان لە ئیش و کار بووەوەو خۆی کرد بە ژوورا ، سەیر ئەکا دەوری زۆپاکە چۆڵەو هێشتا کۆڕ گەرم نەکراوە ، بەسەر سامیەوە وتی: ]

<u>فاطمەخان</u> : ئەرێ ، باوکی ئوسامە بۆچی لە چیرۆکەکەمان بۆ ناگێڕیتەوە ؟ خۆ وابزانم درەنگ بێ؟

[ مامۆستاش کتێبەکەی، بەردەمی پێچایەوەو بێ پەروا بەرەو زۆپاکەخۆی کشاند .. ئوسامە کردی

بەکەمەو وتی : ]
ئوسامە : بابە ، مادام ئەمشەو دایکم فریامان کەوت ئەبێ باسی دایکە گەورە « حەوا » مان بۆ بکەی .
مامۆستا : [ بەپێکەنینەوە ] بە خوا ڕۆڵە ڕاستەکەی هەر چەند بێ منەت سەرەی ئەو باسەبوو .
ئەوە بوو وتمان شەیتان سەر پێچی فەرمانی خوای کردو لە بەهەشت دەرکراو سوێندی خوارد کەڕێی ڕاست لە ئادەم و نەوەکانی بگرێ و سەرگەردانیان بکا . با لێرەدا ئەم باسە بوەستێنین و بگەڕێینەوە بۆ سەر باسی ئەوەی کە باوکە ئادەم تەنیایی و بێ کەسی و بێ هاودەمی خەریك بوو بێ تاقەتی بکا ، تا خوا کردی شەوێکیان بەو بێ تاقەتیەوە سەری نایەوەو کاتێ کە ڕۆژی لێ بوەوە سەیر ئەکات ئافرەتێك لەتەنیشتیەوە دانیشتوە ، زۆر

سەرسام بوو ، لێی پرسی : تۆ چیت ؟! ئەویش
وتی : من ئافرەتم .. ئادەم وتی .. ناوت چییە ؟
وەڵامی دایەوە : ناوم نازانم .. ئادەم وتی ناوت
( حەوا ) یە .

بەم شێوەیە خوا هاودەمو هاو سەری ژیانی بۆ
باوکە ئادەم کەیاند تا پێکەوە ژیان بەرنە سەرو
دڵیان دامەزراو بێ ..

نەسیبە : بابە گیان ، ئایا دایکە حەوا لەچی دروست
بووە ؟

مامۆستا : رۆڵە گیان ، ئەوە بوو وتمان کە بەو
شێوەیە دایکە حەوا سەر لە بەیانییەك لە تەنیشت
باوکە ئادەمەوە سەری هەڵدا .. بەڵام بۆ باسی ئەوەی
لەچی دروستبووە ، خوای مەزن ئەوەندە ئەفەرموێ
کە ئێمە مەردومان لەیەك کەس دروست کردووە

هەر لەو کەسەش هاوسەرمان بۆ دروست کرد .(١)
مانای وایە دایکە حەوا لە باوکە ئادەم جیا کراوەتەوەو
لەو دروست بوە . گرنك ئەوەیە کە ئەمە دەری ئەخا
ژن و پیاو لەیەك لاشە جیا کراوەنەتەوەو زۆر پێویستیان
بە جووتی و هاوسەری هەیە ..

لە پاشا خوای گەورە فەرمانی کرد کە ئەم
ژن و پیاوە لە بەهەشتدا بژین وە ژیانێکی بەهەشتیانە
بەرنە سەر .. وە چی وە چۆن ئارەزوو ئەکەن
بیکەن .. بە مەرجێك تەنها لەو درەختە نەخۆن
کە بۆی دیاری کردبون . وە ئاگاداری کردن کە
شەیتان دوژمنیانەو پێویستە خۆیانی لێ لابدەن و بە
قسەی هەڵنەخەڵەتێن .. چونکە داخڵە دڵەو پاك

(١) « النساء/١ »

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا
زَوْجَهَا

بوونەوەی نیە لە عاستی ئادەمو ئەوەکانیدا .
بێگومـان ئادەمو حەوا لەخۆشیو بەختیاریەکی زۆرابوون لە بەھەشتا وە وەك فریشتە بە ژیانێکی بەھەشتیانە ئەژیان .. ئیتر بیرێکیان لەوە نەئەکردەوە کە نزیکی ئەو درەختـە قەدەغە لێکراوە بکەون .
بەڵام شەیتانی داخ لەدل ودوژمنیان ھەمیشە لەمەلاسدا بوو کە فرسەتیـان لێ بێنێو لەو نازو نیعمەتەیان بکاو ھەق دەربەدەری خۆی لێیان بسـەنێ .. رۆژێك لێیان نزیك بووەوو لە دیمەنی کەسـێکی دڵسۆزا لێیان ھاتە پێش‌و وتی : ئەری کاکە ئادەم ئاتەوێت درەختێکت پیشان بدەم کە لێی بخۆی ئیتر ئەمر ئەبیو مولکی نەبراوەت دەستکەو ئەبێ ؟ باوکە ئادەمیش زۆر سەرسام بوو لەم ئامۆژ کاریە دڵسۆزانەیەو لێی پرسی : کامەیە ئەو درەختە ؟!
ئەویش بە پەلە دەستی درێژ کرد بـۆ ئەو

درەختەی کە خوا قەدەغەی لێ کردبوو .. ئادەم وحەوا وەك لەبانێك بخرێنە خوارەوە ڕاپەڕینو بەبێ فەرمانی قەدەغە کردنی ئەو درەختەیان کردەوەو زانییان ئەمە شەیتانەو ڕێی خراپیـان بۆدائەنێ .. دەمو دەس ڕایان کردو گوێیان نەدایە ..

پاش ماوەیەکی تر لە بەرگێکـی تردا ، وە بە دڵسۆزی وخۆشەویستیەکی زیاترەوە لێیان هاتە پێشو پێی وتن :

بۆیە خـوا ئەو درەختەی لێ قەدەغە کردوون تانەبن بە فریشتەو نەمریتان دەست کەو نەبێ و لە خۆشی ئەم بەهەشتە بەرینە بەری بن . ئەم جارەش ڕایان کردەوە لە دەستی وبە گوێیان نەکرد .. ئەویش ناچار ڕای کرد بەدوایاناو سوێندی بۆ خواردن کە مەبەستی پاکەو بۆ خۆشی و بە ڕژەوەندی ئەوانیەتی .

ئادەمو حەوا هەڵویستانو بە سوێندەکەی سارد بولەوە ، چونکە بە لایانەوە سەیر بوو سوێندبەدرۆ بخورێ .

دایکە حەوا ڕوی کردە باوکە ئادەمو بەدوو دلیەکەوە وتی

ئەرێ ئەم شەخسە سوێندی خوارد ، تۆ بڵێی بە درۆبکا ؟! ئادەم وتی

بە خوا نازانم ، بڵێی ڕاست بکا ؟!

حەوا وتی

بەڕاستی من بڕوا ناکەم درۆمان لەگەڵا بکا چونکە هیچ بەرژەوەندی ئەوی تیا نیە

ئادەم وتی :

ئاخر سوێندی خوارد ، قابیلە سوێند بە درۆوە بخورێ ؟ !

نازانم ، بڵێم چی ؟ بەدەم ئەم قسانەوە پێکەوە

بەرمو درەختەکە کەوتنە ڕێ و . لەبەروبوومەکەیان خواردو .. شەیتان بۆ یەکەم جار دەستی هێنا بەسەر دڵیاو یەکەم ناواتی هاتەدی .. کە بە دووچاوی خۆی دی ئادەم ـ کە یەکەم ملۆزمی ئەو بوو ، وە لەسەر ئەو دەربەدەرو لەعنەت بار کراو بێ ئەمری خوای کرد ـ وا بە پێلاڵی ئەم هەڵخەڵەتاو یەکەمر ـ لەم کاتەدا کە بەرمو درەختەکە نزیک بوبوونەوە ـ لاشەی ئادەم و حەوا ڕووت بوو وە شوێنە داپۆشراوەکانیان دەرکەوت ، شەرمەساری و تەریقی ناوچەوانی ئادەم و حەوای داگرت .. حەپەساویەك گرتنی کە نەیان ئەزانی چی بکەنەوە بە چ کوێیکا خۆیان ئوقم بکەن .. دڵیو دەرونیان خەجاڵەتی دیوانی خوابوو .. ڕووت وقوتی یەکجار شەرمەساری کردن .. ناچار گەڵای درەختەکانیان ئەکرت بەخۆیانەوە تا هەیبەکانیان داپۆشن . ئەم سووچەو ئەو سووچی بەهەشتیان ئەهەکردو ئەیانویست لەبەر چاوی سەربەرشتیارو

دروستکەری خۆیان ڕابکەن ؛ بەڵام چاریان نەبووە.
بەهەر لایەکا ئەچوون هەرسماواو ماڵی خوابوو . تاڵ
بەرزەیی و بەجەم و سەوزی خوا شەپۆلی بۆ هاویشتن و
بانگی لێ کردن :

« ئەوە من ئەو درەختەم لێ قەدەغە نەکردن ؟..
پێم نەوتن شەیتان دوژمنێکی گەورەیەو وریا بن نەتان
خەڵەتێنێ ؟ . ئەی بۆ هەڵخەڵەتانو بە قسەتان
کرد ؟ .. » .

هاواری پەشیمانی و شەرمەزارییان بەرز کردەوەو
وتیان :

« خوایە زوڵممان لە خۆمان کرد بە سەر
پێچی فەرمانی تۆ ، وە ئەگەر تۆ لێمان نەبووریەو
چاوپۆشیمان لێ نەکەی ئەوا زەرەرمەندو ماڵ کاولی
هەردوو دنیا ئەبین » .

بەم جۆرە شەیتان توانی بەسەر ئەو هەموو نازو

نیعمەتەی بەهەشتدا باوە گەورەو دایە گەورەمان
هەڵخەڵەتێنێ بەو درەختە بچکۆلەیە ..
نەسیبە : بابە گیان پرسیارێك ، ئایا ئەم
درەختە چی بوو وا بوو بە هۆی سەرگەردانی و
تاوانکاری حەزرەتی ئادەم وحەوا ؟! ..
مامۆستا : بەڕاستی کیژی من ، مەسەلە گرنگی ئەم
درەختە نەبوو .. چونکە ئەو درەختە وەك ئەڵێن
( گەنم ) بووە کە بە درەخت دانانرێ وە ئەبێ
پێی بوترێ ڕوەك ( نبات ) .. بەڵام هەرچی بووبێ
شایانی ئەوە نەبوو کە بە سەر ئەو هەموو نازو
نیعمەتی بەهەشتەدا دڵیان بۆی لێ بدا .. بەڵام
بناغەی شتەکە ئەوەیە کە خوای گەورە ئەو درەختەی
بۆیە قەدەغە کرد کە بە کردارو وەك ( پەراوە )
دەربکەوێ کە دوژمنایەتی شەیتانو بە چکەکانی لە
قالبو پلەیەکی زۆرو زیادایە ، وە هەروەها ئادەمو

ئەوەکانیش ناتوانن لە بەردەم پیلانەکانی شەیتاندا
خۆیان رابگرن ... ئەگەر بە ئیمانو باوەری قایم
خۆیان چەکدار نەکەن ، وە دەماری کێلیەتیو دل
فەقیری لە خۆیانا نەمرێنن .. وە هیچ کات نابێ لە
شەیتانو پیلانەکانی ئەمین بن ..

فاطمەخان : بەراستی کۆشەی ئەم شەومان چەند
دەرسێکی گرنگو باسێکی ساماکی هێنایەوە بیرمان ..

مامۆستا : راستە ئێمە لەم کۆشەیەدا دەرسی وریا
بوونەوە وحساب کردنی دۆستو دوژمن فێر ئەبین ،
فێری ئەوە ئەبین کە مرۆڤ ـ هەر لەئادەمەوە تا
ئەمرۆ ـ قابیلی هەڵەو تێکەوتنو خەتایە ، بەهۆی
ئەو پیلانو داوە ناسینانەی شەیتانی دوژمنمانەوە .
بەڵام خۆش ئەوەیە کە بە ئاگری ئیمانو باوەری
خوایی ئەو داوو زنجیرانە بتوێنینەوەو لەو تلوانو
خراپانە پەشیمان بینەوە .. چونکە قابی

لێخۆش بوونو چاوپۆشی خوا هەمیشە لە سەر پشتەو خوا زۆر حەز بە پەشیمان بوونەوەی بەندەکانی ئەکا .

فەرموودەیەکی جوانی زانایانی ئیسلامیش هەیە کە دلی ئێمەی تاوانبار وکەم دەرامەت خۆش ئەکا :
« بکرە گوناهو خراپەیەك کە شەرمەساریو گری هەردەم قاپی خوا بە خاوەنەکەی ببەخشێ باشترە لای خوا لە پەرستشو بەندایەتیەك کە سەرکەشیو فیز بە خاوەنەکەی ببەخشێ » .

ئەوەتە ئادەمو حەوا تا ئەو گوناهەیان نەکرد دەستی پارانەوەو نزایان بەرزنەکردەوە ..

حەمزە : بە راستی بابە گیان زۆر جوانە ؛ خوا تۆمان بۆ بهێلێ تا بەم دەرسە جوانانە گەرمان کەیتەوەو لە سەرماو سۆڵەی رۆژگاری گەچ رەو رزگارمان بێ ..

ئوسامە : بابە گیان ئەم دەرسەمان زۆر خۆش بوو ،

بەڵام دڵی من شتێکی تیایەو ماخۆلانیەتی‌و ئەیەوێ تەکەرە بخاتە باوەڕمەوە ، ئەویش ئەوەیە کە : ئایا خوای پەروەردگار - بە قوربانی ناوی بم - بۆچی ئەم مڵۆزمەی بۆ باوکە ئادەم‌و ئێمەی ئور بە سەر راست کردەوەو بۆچی مژڵەتی شەیتانی‌دا چکە بمێنێتەوە تا ئەم دەورە پڕ لە ئاڵوانە ببینێ ؟!!.

مامۆستا : بە خوا ئوسامە گیان پرسیارەکەت زۆری

---

ترساندوم ، چونکە ئەترسم بێ ئەدەبی بێ بۆ ئێمەی هیچ نەزان‌و بەندە کە قسە لە ئیشی خوادا بکەین‌و وتەی [ بۆچی ؟ ] بەکار بێنین ، چونکە ئەوە بڵێین ئەبێ بڵێین زەوی‌و ئاسمان‌و مرۆڤ‌و گیان‌لەبەران بۆچی دروست‌بوون .. ؟ بەڵام نا ، خوای پەروەردگار ئەفەرمـــوێ : «لا يُسْـــأَلُ عما يَفْعَلُ وهم يُسْأَلُون »(١) .

---

(١) واتە : پرسیار لە خوانا‌کرێ ، لەوەی کەئەیکا بەڵکو ئەو پرسیار لە دروست کراوەکانی ئەکا ..

بەلام تۆ ـ إن شاء الله ـ مەبەستت بۆ ئەدەبی نیەو نیازت وەرگرتنی پەندو حیکمەتی ئیشەکەیە ..

بۆ وەلامی ئەمە ئەلێم بەراستی وەك پێشینان وتویانە :
« بوار قاچو تولی رەش و سپی دەرئەخا » ، ئەگەر شەیتان نەبوایە پاکو پیسی ئەم خەلکە نەئەکرا ...
هەروەهـا خوای عالەمیـان خواهیشی وابوە کە ئەم ئەستێرەیە ( واتەزەوی ) بەرێز رابگرێو ئاوەدانی بکاتەوە . جا ئەگەر ئەو تەکبیرە خواکردە نەبوایە بلوکە ئادەمو دایکە حەوا لە بەهەشـت دەر نەئەچوون ، وە مرۆڤ لە هونەری خۆ پاراستن لە دوژمن ناحالی ئەبوو کەواتە : ئەوەندەمان بەسە کە خوای پەروەردگار بە نەخشەو رەنگ رێژی ئیشەکانی خۆی بوونی ئەو ملۆزمەی بە پێویستـە زانیوە .. تا سزاو پاداشت بێو چاکو خراپ جیا بکرێتەوە .. جگە لەوەش کە خـوای گەورە نە

چەپەرستن گەورەیی زیاد ئەکا وە نە بە سەرپێچی لە
گەورەییەکەی کەم ئەکات ، بەڵکو پاکی لە هیچ نیەو
تەنها میهرەبانیەو رەحمی فراوانی خۆیەتی چەکە
پێغەمبەران ئەنێرێو رێگەی راست بۆ مەردوم دیاری
ئەکا .. شەیتانیش دوای ئەوەی کە لەبەهەشت
دەرکرا بە هۆی فیزەوە ، ئیتر لە ریزی فریشتەکانا
نەما ، ئەم پیشەیەی گرتە دەست ، لە ئەنجامیشا
هەر پەشیمان ئەبێتەوە وبە بەچکەو شاگردو شوێن
کەوتوەکانی ئەڵێ : خوا بەڵێنی راستی ئەدانێو من
بەڵێنی درۆ ، کەچی بڕواتان بە من ئەکردو منیش
نەم توانی بەڵێنەکەم بەرمە سەر . خۆ من هیچ
دەسەلاتێکم بەسەرتانا نەبوو جگە لەوە نەبێ کە
رێگەی خراپەم بۆ دیاری ئەکردنو ئێوەش پیایدا

ئەچوون وەبە گوێتان نەکردم (١) .

وە لە دادپەروەری پەروەردگارەوە دوور نیە کە ئەم
مۆلەت داتو دلوا بەجێ هێنانەی شەیتان لە پاداشتی.
ئەوەدا بێ کە شەیتانیش تا ئەو کاتە خواپەرستەکی
بەجێ هێنەری فەرمانەکانی خوابووە .

بێ گومانیش بێ کە ئێمەی بەندە هەرگیز چاومان

---

(١) لە سورەتی [ ابراهیم ]

وَقَالَ الشَّيْطَانُ

لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ
وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلَّا أَنْ دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي
فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ

حوکمی ئەوەی نیە کە بە تەواوی نهێنی ئیشەکانی خوا ببینێ ، بەڵکو تەنها دەستنیشان کردنێکی دوور بە دووری‌یەو بەس ...

ئیتر درەنگە . با بیکەین بە شەو ، ئەمشەو ، تا سبەی شەو خـوا یاربێ لەئەنجـامی سەرپێچیەکەی ئادەم‌و حەوا ئاگادارئەبین ..

## بسم الله الرحمن الرحيم

قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا

جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ

وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۞ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ

أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ

[ البقرة ]

## بسم الله الرحمن الرحيم

۞ قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا

بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا

يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ۞

[ طـــه ]

[ مالی مامۆستا ڕەحیم ئەمشەو بە کۆمەڵ لە
دەوری زۆپاکەیان کۆبوونەتەوەو چاوەڕێی مامۆستا
ڕەحیم ئەکەن کە لە نوێژو پاڕانەوەکەی ببێتەوە
وکوزەڕە چێوك خوانیەکەی گەرم بکا .. زۆری پێ
نەچوو هەستاو بەرماڵەکەی قەدکردو خێزان لەبەری
هەڵسانو جێیان کردەوە لە نێوان خۆیاندا و هەموو
دانیشتنو مامۆستا هاتە گفت : ]

<u>مامۆستا</u> : دوێ شەو گەیشتینە ئەوەی کە شەیتان
توانی داخی دڵی خۆی برێژێو مۆری بێ گوێیی و
سەرپێچی فەرمانی خوا بنێ بە ناو چەوانی ئادەمو
حەوادا . جا کە کەتنەکەی پێ کردنو تاوانەکەیان کرد
ئینجا هەستو هۆشیان کەوتە جۆشو هەستیان بە

ئالی خەتاباری کردو کەوتنە پاڕانەوەو داوای لێخۆش بوون .

بێ گومان خواوەندی میهرەبان لە بەندەی خەتابارو پەشیمان خۆش ئەبێ .. بۆیە مژدەی لێخۆش بوونی دانێ .. بەڵام ئاگاداری کردن کە تازە مانەوەیان لە بەهەشتدا نابێ و ژیانی بەهەشتیانەیان تەواو بوو ، وە ئەبێ بچنە سەر زەوی وە دەست بکەنە ژیانی مرۆڤانەو بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بژین .. بەڵام ئەگەر پەیڕەوی تەکبیرو پەیامی خوا بکەن ؛ ئەوا گوزەرانێکی خۆش وپاشەڕۆژێکی باشیان ئەبێ وە هەرگیز سەرگەردان نابن و دیسانەوە ئەگەڕێنەوە بۆ بەهەشت ..

ئابەو جۆرە ئادەم و حەوا لە بەهەشت دەرکران و دەستیان دایە ژیانی مرۆڤانە لەسەر ئەم زەویەدا ...

ئەسیبە : ئەرێ بابە شەیتان دەوری دیار نیە دوای

کەتنەکەی ؟ !

مامۆستا : شەیتان ئاواتی خۆی هێنایە دی بەوەی ئادەم و حەوای هەڵخەڵەتان .. ئیتر پاڵی لێ دایەوەو سەیری ڕەنجەڕۆیی و گیرۆدەیی و شورمە ساری ئادەم و حەوای ئەکرد .. ئیتر دەرەقەتی ئەوان نەئەهات چونکە تازە تامی تاڵاوی هەڵخەڵەتاندن و پیلانەکانیان کرد بوو .. بۆیە ئیتر کەوتە تەنیق داوو زنجیری هەڵفریودان بۆ نەوەکانی ئادەم ..

ئوسامە : بابە گیان ، داخۆ ئەو بەهەشتە کام بەهەشتە بووبێ ؟ ئەوەیە کە لە پاداشتا خوا ئەیبەخشێ بە موسڵمانان یان یەکێکی تربووە ؟!

مامۆستا : ڕاستیەکەی هێشتا بۆ کەس ساغ نەبۆتەوە کە ئەو بەهەشتە کامەیەو لەکوێیە .. چونکە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا - ﷺ - باس نەکراوە ، وە زاناکانیش بۆیان ساغ نەبۆتەوە ،

بەڵام چەند رایەك هەیە لەم بارەیەوە :

هەندێك ئەڵێن : ئەو بەهەشتە ئەوەیە کە بۆ موسڵمانان ئامادەکراوە .

هەندێك ئەڵێن : ئەو بەهەشتە بەهەشتێکی جیاوازە .

هەندێك ئەڵێن : باخچەیەك بووە لە زەویدا ، وە هەروەها هەندێکیش لێی بێدەنك بوون ....

بەڵام بەلای منەوە : گرنك نیە لە کوێ بووە .. بەڵکو گرنك ئەوەیە کە ئادەم و حەوا ژیانێکی بەهەشتیانەیان ئەبردە سەر ! هیچ جۆرە زەحمەت و ئەگەرەیەك رووی تێ نەئەکردن .. بەڵام لە ئەنجامی ئەو خەتایەدا لەو ژیانە بەری کران وە خرانە ناو ژیانێکی زەمینیـانەوە .. واتە مرۆڤانە دەژیان و دەمردن و زەحمەت و ماندوبوون و کێو گرفتیان هەبوو .. جگە لەوەی کە بەرپرسیاری لای خوا ئەبن

له بەرانبەر کردەوەکانیاندا ..

حەمزە : ئەم ڕوون کردنەوە زۆر جوان بوو وەڕاکەی

تۆش زۆر ئەگونجێ لەگەڵ بناغەی باسەکەو بۆ

دەنکیەکەی ئایەت و فەرمودەی پێغەمبەر - ﷺ -

لێیەوە هەروەك شتێکی نموونەیی بێ و بەس بەڵام

منیش شتێکم لاسەیرە کە : ئایا باوکە ئادەم ئەگەر

پێغەمبەر بووە ، چۆن خەتای کردووەو لە فەرمانی خوا

دەرچووە .... ؟!!

مامۆستا : پرسیارێکی جوانە : ئاشکرایە کە

پێغەمبەران خەتایان نەکردووە .. کەواتە بۆچی باوکە

ئادەم ئەوبێ ئەمریەی کرد ؟!

پێشەکی : لەقورئانی پیرۆزدا پێغەمبەریەتی

بۆ باوکە ئادەم باس نەکراوە . ئەوەندە هەیە کە بە

پێی ئەوەی - وەحی - بۆ هاتووەو خواوەند ڕاستەوخۆ

فەرمانی بۆ ڕەوانە کردوە ؛ مانای وایە ئیشەکەی

پێغەمبەرانە بووە .. چونکە ئەگەر ئەو بە پێغەمبەر
نەژمێرین ؛ ئەبێ پێغەمبەرێکی بۆ بڕیار بدەین .
ئەوەندە هەیە کەوا دیارە تەنها پێغەمبەری مالی
خۆی بووە ، واتە ( نَبي ) بووە نەك ( مُرسَل ) ..
بەلاّم بۆ وەلاّمی ئەوەی کە پێغەمبەر چۆن لە فەرمانی
خوا دەرئەچێ ؟ چەند شتێك هەیە ، بەلاّم هیچیان
وەك ئەمە ناچێ بە دلّمەوە ؛ کە حسابی پێغەمبەریەتی
ئادەم جیاواز بووە ؛ وە حـــــابی خەتاکەی‌و
دەرکردنەکەشی لە بەهەشت هەر جیاواز بوو ؛ هەر
لەبەر ئەمەشە کە قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا دان
نانێ بە پێغەمبەرایەتیەکەیدا .. چونکە لە ڕاستیدا
مۆلّەت دانو بەرەلاّ کردنی شەیتان ودروست بوونی
لاشەیی‌و هەستو هۆش‌و فامو ژیری ئادەمو ئەدەفە
کردنی درەختێك بە دیاریەوە ، گشت نەخشەیەکی
تایبەتی‌و جیاوازی خوایی بووە .. بۆ ئەوەی کە

ئەوەکانی ئادەم بەو ـ پەراوە ـ بە حالی بێن کە شەیتان ئەوەندە دوژمنێکی بە کارو لێ هاتووەو مرۆڤیش ئەوەنـدە دەستەو لاوازو بێ وزەیە ئەگەر فەرمـانو پەیامی خـوای لە بیر بچێتەوە . وە مادام شەیتان لە مەلآسدا بوو وەك دوژمنی خوێنە خۆری ئەبوایە یەکەم مرۆڤ یەکەم چەپۆکی شەیتانی بەر بکەوتایە : جا با ئەو مرۆڤەش پێغەمبەر بووبێ ... تا نەوەکانی ئادەم بە چاکی خۆیان لە شەقی شەیتان لا بدەن و بەزنجـیری باوەڕی قایمی خوایی و شوێنکەوتنی پەیامەکانی خوا دەستەو قاچەکەی پێوەند بکەن .

لە لایەکی ترەوە لە بەر ئەوەی کە ئادەم نموونەی مرۆڤەو هەموو خاسیەتێکی مرۆڤی تیایە ، لە چاکەو لە خراپە ، لە ئازایەتیو خۆگرتن وە لە بێدەسەلاتی وبەزاندن ، وە لەبەر ئەوەیش کە ئادەم نموونەی

مرۆڤێکی خواناسە ، لەبەر ئەوە گرنگ نیە تاوان بکا ، چونکە تاوان کردن وە یا لەبیر چوونەوەو خەڵەتان پیشەی هەموو ئادەمیەکە . دیسانەوە گەڕانەوەو دان نانیش بە تاوانی خۆیا هەر پیشەی مرۆڤی خواناسە .

کاتێ کە ئادەم تاوانی کرد ـ واتە خەڵەتاو فەرمانی شکاند ـ لەو کاتەدا ئەو نەنێررابوو بۆ سەر هیچ کەسێك ، واتە سەرکردایەتی ئایینی خوای بە دەستەوە نەبوو تا بە تاوان کردن خوا لێی بگرێ‌و لێی خۆش نەبێ ..

جالێرەدا خوا ئەیەوێ ئەو نەخشەیەی کە خۆی کێشاویەتی بێتە دی ، ئەگەر ئادەم تاوانی نەکردایە چۆن ژیانی سەرزەوی دەستی پێ ئەکرد ؟

بەڵام واچاکە هەمووی بدەینەوە دەست خوا چونکە خۆی نیازی وایەو نەخشەکەی واپێویستە

ئەكات .. وە كەبەندە ڕوو لە خوابێ ، خوا هەر لێی خۆش ئەبێو لێی نارەنجێ .. جا حەمزە گیان من ئەمەندەی لێ ئەزانم ، وە خواش ئاگادارو زاناترە ..

با بێینەوە سەر باسەکە : ئەوە بوو وتمان

ئادەمو حەوا لە بەهەشت دەرکران ، یەك دوو ڕۆژ سکیان کوشی لە برسانا ، سەیر ئەکەن دانیشتن بێ کەلکە وئەبێ بجووڵێن لەو زەویە وشـكو ڕەقەدا ناچارن ڕزقو ڕۆزی پەیدا بکەن ؛ لە گەرماو سەرما خۆیان بپارێزن . ڕۆژ تا ئێوارە بە جووتە ئەگەڕان بە دوای بەرو بوومی درەختا بۆ خواردەمەنی ، بە دوای ڕۆزیو تفاقێك بۆ سکیان .. بە دوای دارو پەردوی ئاگردا ...

بەم شێوەیە کیەزۆدەی ژیانی سەر زەوی بوونو دەستیان دایە ژێر بار خستنی ئەو شتانەی کە ئەکەونە بەردەستیان .. پاش ماوەیەك دایکە حەوا

سکی پڕ بوو وە نزیکی نەخۆشی منداڵ بوونی بووبەو بۆنەیەوە ئیش وکاری دەرەوە کەوتە سەر شانی ئادەم ..

تا ئێرە ئەم شەو بەسە تا سبەی شەو بە خواتان ئەسپێرم ...

## بسم الله الرحمن الرحيم

← ﴿٢٧﴾ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ

[ المائدة ]

* * *

— ٥ —

[ کوڕه چیرۆك خوانیه کەی ماڵی مامۆستا ڕەحیم خەریکی گەرم بوونە ، خێزانیش گشت ئامادەن . مامۆستا دەستی پێ کرد ] .

مامۆستا : دوێ شەو وتمان ژیانی ئادەم و حەوا لە فریشتەیی دەرچـــوو کـۆرا بۆ ژیانی مرۆڤانە .. هەستیان کرد بە برسیەتی و تینویی و تێری و سەرماو گەرما .. زێو زاکەوتە ناوەوە ، دایکە حەوا سکێکی دوانەی بوو ـ کوڕو کچێك ـ بۆ ساڵی داهاتویش هەمان شێوە کچ و کوڕێکی تری بوو .. دوو کوڕەکە ناویان « قابیل » و « هابیل » بوو .. خێزانی ئادەم زۆر بوو .. وە هەریەکەیان فرمانێکیان بۆ دیاری کرابوو ، کوڕەکان پارمەتی ئیش و کاری باوکیان ئەداو کچەکانیش

وردە ئیشیان ئەکردو یارمەتی دایکیان ئەدا ...

بەڵام ئەوەی شایانی باسە « قابیل » زەلامێکی زۆر دڵ ڕەق و ڕەزیل و خۆپەرست بوو .. بۆیە باوکی زەوی کێڵان و دەغڵ و دان چاندنی دابووە دەست ، چونکە تەنها مەگەر زەوی پێویستی بە دڵ نەرمیو بەزەیی نەبێ ..

بەڵام « هابیل » کوڕێکی زۆر بە فام و دڵ نەرم و ژیر بوو هەمیشە حەزی لە کوێڕایەڵی دایك و باوکی ئەکرد ... وە ئامانجی ڕەزامەندی خوابوو .. بۆیە باوکی شوانیەتی مەڕ و ماڵاتی دابووە دەست ، چونکە شوانیەتی بێ‌زمان و گیان لەبەران ؛ زۆر پێویستی بە ڕەحم و سۆز و دڵ نەرمی هەیە .. وە باوکیەیان ڕاوی کرتبوە دەست .. لە گەڵ ئاسۆی بەرەبەیاندا هەر سێ پیاوەکە بەرەو ئیشەکەیان دەرئەچوون ، دایکە حەواش لە ئەشکەوتە کەدا ئەمایەوەو سەرپەرشتی

ئیش و کاری ماڵەوەی ئەکردو کچەکانی ئەخستە فرمان وخۆیشی وردیلەکانی بەخێو ئەکرد ، کە ئێوارە ئەهات هەر سێکیان بە دەستەکەوتەکانیانەوە ئەگەڕانەوە ، باوکە ئادەم بەنێچیری ڕاوەوەو قابیل بە بەروبوومی کشتوکاڵەوەو ، هابیل بەشیری ماڵاتەکەیەوە ..

ئێستا کێشەیەك بەرۆکی ئادەم و حەوای گرتوە(۱) کوڕو کچی عازەبیان هەیە .. ئایا بە چ جۆر ئارەزووی جوتیەتی و جنسی « بێتەدی لە ناویانا ... چۆن ژن و مێردییان ڕێك بخەن .

ئاخ وای کەوەرە ئاگاداری کردن کە ئەگبیریان ئەوەیە : ئەو کچەی کە لەگەڵ قابیل لە دایك بووە ،

(۱) سەیری ( بجلده ص ۳۱۰ ) کتێبی ( ارشاد الساری في شرح البخاری للعلامة ابن حجر القسطلاني ) بکە .

بدرێ بە هابیل ، وە ئەو کچەی کە لەگەڵ هابیل لە دایك بووە بدرێ بە قابیل ... ئەمە باشترین ئەگبیرو چارەسەر بوو بۆ ئەم کێشەیە ....

بێ گومان باوکە ئادەم نایەوێ جارێکی تر لە فەرمانی خوا دەرچێ ، بۆیە فەرمانەکەی خوای بە کورو کچەکانی کەیاند ..

بێ گومان هابیل گوێ رایەڵەو بە بەشی خوا رازیە . بەڵام قابیل لەمەیشدا هەر دڵ رەقو سەر کەش وەکـەو ئەڵێ : ئەبێ هەر یەکمان خوشکەکەی خۆمان مارە بکەین ...

باوکیان داماو دووچار بوو چی بکا لەم کورە بێ مێشکە کەللە رەقەی . . خۆ کورێکی وا نیە بە ئامۆژگاری بسەلێ .. تا خواوەند لەمەشدا ئەگبیری بۆ کردن ، فەرموی : با هەریەکەیان خێرو قوربانیەك لە بەرهەمی ئیشەکەیان ، بینە سەر شوێنێکی بەرز ـ

جا خێرو قوربانی هەرکامیان وەرگیرا ئەوە بەقسەی ئەو ئەکرێ ..

هابیلی ژیرو تێگەیشتوو بە کەیفو خۆشیەوە چوو بۆ ناو مەڕو ماڵاتەکەو چاکترین حەیوانی هەڵبژاردو هێنای ..

بەڵام قابیلی بێ مێشك بە هەزار دل ـ تەنگیو زەحمەتەوە چووە ناو کێڵگەکەی وکەڕا چ ـ بەرهەمێکی خراپو ڕزیو بوو هێنای ..

هەردووکیان خێرەکەیان بردە سەر لوتکەی شاخێك وبەجێیان هێشت .. بۆ سبەینێ هاتنەوە سەر شاخەکە سەیر ئەکەن خێرەکەی قابیل لەجێی خۆیەتی بەڵام خێرەکەی هابیل نەماوە . بەمەدا زانیان کە خێرەکەی هابیل وەرگیراوەو قبوڵ بووە وە ئەوگرەوی بردووەتەوە کە قسەکەی ئەو لە سەر فەرمانەکەی خوابوو .. چونکە ئەو سەردەمە بەوەدا

ئەیان زانی کە خێرەکە قبوول کراوە کە نەئەما لە جێکەکەی خۆی . .

بێ‌گومان بەمە ڕقە گەورەی قابیلی دڵ ڕەق و ڕەزیل ودڵ پیس جولاو بڕیاری سەر خواردنی هابیلی برای‌دا ..

ئەمەندە ئەمشەو بەسە بۆ سبەی شەو ـ خوایاربێ ـ بەسەرهاتی کوشتنی هابیلی بۆ تاواتتان بۆ ئەگێڕمەوە .



# بسم الله الرحمن الرحيم

قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ
إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا
بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّي
أُرِيدُ أَن تَبُوأَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَاؤُا
الظَّالِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ
الْخَاسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ اللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي الْأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ
يُوَارِي سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَا وَيْلَتَىٰ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا
الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ ﴿٣١﴾

[ المائدة ]

[ ئوسامەو حەمزەو نەسیبە بەکران ئەو ڕۆژەیان لێ ڕابورد لە تاو پەلەو مەراقی کۆرە چیرۆك خوانیەکەی باوکیان .. مامۆستاش مێشێ میوانی نیەو بە شێنەیی و ئەدەب ونارامەکەی خۆیەوە نوێژەکەی خەوتنانی کردو سەر شانۆکەی گرتەوەو بانگی فاطمە خانیان کردەوە ومامۆستا دەستی بە چیرۆك کردەوە ] .

مامۆستا : دوێ شەو ئەوە بوو کەیشتینە ئەوەی کە

خێرەکەی قابیل وەرنەگیرا ، چونکە بە دەستەو دلێکی ساردو ناپاکانەوە کردبوی وە لەسەرەتا شەوە هەر کیچەلی ئەکێراو ناحەقی لە براکەی ئەکرد ..

قابیل بە یەکجار بووە پارچەیەك لە ڕقو کینەو

دڵ پیسو بەغیلیو ڕووی کردە هابیلی برایو پێی وت : ئەبێ بتکوژم .. !!

هابیلی خوا ناسیش وتی : بۆچ ئەمکوژی ؟ !! خواخێرو قوربانی لە مرۆڤی لە خواترسو دڵپاك قبول ئەکا . وە ئەوەش بزانە ئەگەر دەستم بۆ درێژ بکەیو بمکوژی ؛ من دەستت بۆ درێژ ناکەمو ناتکوژم ، چونکە من لە خوای عالەم ئەترسم .. من ئەمەوێ گوناهی تۆ نەیەتە کۆڵی من ، بەڵکو ئەمەوێ گوناهی منیشو گوناهەکانی تریشت لەسەرت کەڵەکە بێو بۆ دۆزەخت بەرن . چونکە بە ڕاستی ئەم دڵ ڕەقیو تاوانو وزۆرداریەی تۆ سزای هەردۆزەخە ..

هابیل بڕیاریدا کە ئامادەیە قابیل بیکوژێ بەڵام ئەم ئامادە نیە قابیل بکوژێ .. چونکە ئەیویست لە نامەی کردەوەکانی دا خراپە نەنوسرێ .

بەڵام قابیل هەروەك پەیمانی دابێ بە شەیتـان کە نۆکەری هەمیشەیی بکاتەیئەتوانی لەوتاوانە گەورەیە پەشیمان بێتەوە . بۆیە دەستی تاوانو زۆرداری بۆ برا بێ تاوانەکەی درێژ کردو کوشتی ..

ئەبێ ئەم قابیلە دڵرەقە خـاوەنی چ ناپاکیو کەللە رەقیەکی بێ ئەندازە بووبێ کە توانی بۆ یەکەم جار کوشتن دابهێنێ .. وە ئەخشە تاریكو رەشەکەی بهێڵێتەوە بۆ پیاو کوژەکانی دوای خۆی ..

بەڵێ هابیلی کوشـت ، وە گیانی پاکی بەرەو بەهەشت کەوتە رێ ؛ بەڵام قابیـل مایەوە لە ژێر باری گوناهو تاوانا .. بە دیار تەرمی براکەیەوە .. بە دیار خوێنی کەشی ڕژاوی بێ تاوانیەوە .. دەماری چاکەو پیاوەتی هاتە لەرزە .. چی کرد .. ؟! بۆچی وای کرد .. ؟! تەکبیری چیە ؟ ! ئەم لاشەیە چی لێ بکا ؟ خۆ تازە لەکیس چوو و زیندوو نابێتەوە ...

نەیئەزانی چی کردو چی بکا ؟ سەرکەردانو وێڵ
وێڵ ئەسووڕایەوە بە دوای چارەسەردا .. تا خوای
میهرەبان لێرەشدا فریای بنەماڵەی باوکە ئادەم
کەوت ، قەلەڕەشێکی نارد بۆ ئەوەی فێری ناشتنی
براکەی بکات .. قەلە ڕەشەکە بە دەنوك چاڵێکی
هەڵکەندو قەلەڕە شێکی مردوی هێناو خستیە ناو
چاڵەکەوە وخاکی دا بەسەردا ـ لەم کاتەشدا قابیل
سەیری ئەکرد ـ کە چاوی بەمە کەوت : هۆشێکی
کردەوەو دەستی کرد بە چاڵ هەڵکەندنو براکەی
خستە ناوی‌و خاکی دا بەسەردا ـ بەم جۆرە قابیل
ئاوی پیاو کوشتنی ڕشت ، وە بووە سەرمەشق بۆ
ئەوانەی کەدەستیان ئەچێتە ڕشتنی خوێنی بێ‌تاوانەکان
ئەوانەی کە سەرکەوتن ئەیان خەڵەتێنێ وە دەسەڵاتی
خوای مەزنیان لەیاد ئەچێ‌و بەدڕەفتاری ئەکەن ..
حەمزە : بابەگیان پرسیارێکم لە دڵایە : ئایا بۆچی

دەستی شەیتان لەم تاوانەی « قابیل » دا ـ بەڵکو لە گشت تاوانێکی تردا ـ دیار نیە ؟! بە مەرجێك ئێمە ئەڵێین : شەیتانە خراپەمان پێ ئەکات ؟ .

مامۆستا : مەبەست ئەوە بێ کە بۆچی بەئاشکرا لەو لە شێوەی زەلامێکدا شەیتان لە خراپەکاندا دەرنا کەوێت .. ؟ هەروەك لە مەسەلەکەی باوە ئادەمدا ئاشکرایە .. ؟! ئەم باسەمان جارێك کرد . بۆ وەڵامی ئەمە ئەبێ بزانین کە شەیتان جنۆکەیەکی خوا یاخی بووە وە ئیشو تاواتی شێواندنو گومرا کردنی مرۆڤە ... ئیتر مەرج نیە لە قاڵبی زەلامێکدا خۆی پیشان دات .. چونکە ئەو هێزێکی نەبینراوو دەسەڵات دارەو سەرۆکی دەوڵەتی خراپەو تاوانە .. وە هەمیشە گشت جۆکەلەو زەلکاوێکی خراپە کاری لەسەر چاوەو کانیاوی شەیتانەوە هەل ئەکرێت .. وە هەموو چاکەو دڵپاکی وخێر خواهیەك لەخواوەیە ..

ئەوەتە هابیل کە سەر بە چاکەو خواناس بوو؛ ئەوەندە پاکو مەردو بێوەی بوو. وە قابیل کە سەر بە خراپەو شەیتان دۆست بوو: ئەوەندە دڵڕەقو تاوانبار بوو، خۆ ئەگەر ئەم دوژمنە تاوانبارە بە ئاشکرا بمان بینیایە، ئەو کاتە ئەمان توانی لە پیلانەکانی بە ئاشکرا خۆمان بپارێزین: وە ئەم شاراوەییەشی وا لە مرۆڤی هۆشمەند ئەکا کە هیچ کات لێی غافڵ نەبێ، چونکە ئەو هەمیشە لەسەنگەری دوژمنایەتیو پیلان گێڕاندایە(١) بۆمان.

نەسیبە: بابە ئەوە بۆ ڕاستەوخۆ فەرمانی خوا نەهاتە خوارەوە بۆ قابیل کە فێری چۆنیەتی ناشتنی براکەی بکات؟!

(١) «إنَّ الشَّيطانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فاتَّخِذُوهُ عَدُوّاً».

«فاطر / ٦»

ماموستا : ڕۆڵە گیان هەڵبەت لەبەر ئەوە بووە کە

قابیل شایانی ئەوە نەبووە کە خوا پەیوەندی پێوەبکا .. وە لەبەر خاتری لاشەکەی هابیل کە ئەبوایە کفن‌و دفن بکرایە قەلەڕەشی نارد کە ماموستایەتی قابیل بکاو فێری ناشتنی براکەی بکا ... بەمەدا دەر ئەکەوێ کە ئەگەر ئادەمیزاد لەڕێی خوا لای‌داو سەر بەخراپە بوو ئەوە نەك لەجێ‌نشینیەکەی ئەکەوێ ، بەڵکو قەلەڕەشەیەك لەوبەڕێزتر ئەبێ‌و شایان تر ئەبێ کە خوا پەیوەندی لەگەل بکاو بیکا بەماموستای لەو ..

تا ئێرە بەسە لەبەسەرهاتی قابیل وهابیل‌یش .. وە ئەوەی لەقورئان‌و فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ـ ﷺ ـ باس کرابێ لەسەرگوزەشتەی باوە ئادەم‌و دایە حەوا ئەمەندە بەسە ، صبەی شەو ـ خوا یاربێ ـ لەسود و بەهرەی ئەم چیرۆکمان ئەدوێین ...

# بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ لقد كان في قصصهم عبرة لأولي الألباب ما كان حديثا
يفترى ولكن تصديق الذي بين يديه وتفصيل كل شيء وهدى
ورحمة لقوم يؤمنون (١١١) ﴾

« يوسف »

— ٧ —

[ كۆڕ گەرمەو مامۆستا ڕەحیم لە جاران ئامادەتر لێی هاتوەتە پێش‌و قسە ئەكا ] .

مامۆستا : لەبەر ئەوەی قورئان دەستووری ژیانەو یاساو پرۆگرامی میللەتی ئیسلامە گشت ڕێگەیەكی گرتووە بۆ ڕێنموویی‌و بەختەوەری موسلمانان‌و چەكدار كردنیان بە چاكترین‌و گونجاوترین چەك‌و كەرەسەی پێشەوایەتی كردنی مرۆڤ .. وەئەم چەند دێڕەی ئێمە ئەم چەند شەوە كە لەسایەیدا ژیاین ! چەند پەندو دەرسێكمان دائەدات كە مەگەر تەنها لەقورئان بێت مامۆستایی ئاوەها بكات ; وە حەز ئەكەم ئێوەش یارمەتیم بدەن لە كۆلینی پەندو دەرسەكاندا .
فەرموو ئوسامە گیان ...

ئوسامە : یەکەم دەرسیان بەلای منەوە ئەوەیە : کە

ئەبینین خوای پەروەردگار چ بەرزیو ڕێزو قەدرێك بۆ ئادەمو ئادەمیزاد بڕیار ئـــەدا (١) وە ئەیکاتە خەلیفەو جانیشینەی خۆی .. وە چۆن ئەو فریشتانەی کە هەمیشە فەرمانبەری ئەکەن فەرمانیان پێ ئەدا کە کڕنوش بەرن بۆ ئادەم(٢) کە لەمەوە شەرمەندەیی و منەت باری ئادەمیزاد لەحاستی خواوەندی میهرەبانندا دەرئەکەوێ ... وە هەروەها بەرزیو بلندی پایەی ئادەمیزاد ئاشکرا ئەبێ .. وە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە

(١) وەك ئەفەرموێ : « وإذ قـال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة » . «البقرة»
وەهەم ئەفەرموێ : «ولقد كرمنا بني آدم ...»
( الاسراء / ٧٠ )

(٢) « ثم قلنـا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس » ( الاعراف / ١١ )

که خوای پەروەردگار ئادەمیزادی بۆ کارگوزاری‌و هەڵسوڕاندنی ئیش‌وکاری جێگەداری خۆی‌و سەرداریەتی ئەم جیهانەی دروست کردووە .

جانەوانەی ئەیانەوێ پەتی پەیوەندی نێوان مرۆڤ‌و ئەو خواوەندە میهرەبانە بپچڕێنن‌و مرۆڤەکان بێ‌خوابکەن ؛ تەنها مەبەستیان ژێر چەپۆك خستن‌و بەخسیرکردنیانە .. چونکە ئەو مرۆڤەی کە هەست بە بەرزی پلەی خۆی بکا وخوای خۆی بە ڕاستی بناسێ ؛ هەرگیز سەر بۆ ئەو باوە قوورەتە ناپیاوانە شۆڕ ناکاو هەمیشە کوتەکی لە ئاوایە بۆ فەلاقەیان .

مامۆستا : زۆر جوانە یەکەم دەرسمان با باسی بەرزی‌و بلندی پلەی ئادەمیزاد بێ لای خوای پەروەردگار ...

بەڵێ مرۆڤ لە لاشەو گیان ـ جسم وروح ـ دروست بووە . لاشەکەی لە گڵ دروست بووە ،

بەڵام گیانەکەی لەخواوە پێی بەخشراوە(١) کەواتە گەورەیی و بڵندی ئادەمیزاد لەوەوەیە کە گیان و ڕۆحەکەی لەخواوە پێ بەخشراوە و لە قاپلۆخی لاشە خۆڕەکەیدا هەڵنەسوڕێ وتوانا و هێزی خەلیفەیەتی ـ خوا و سەرداریەتی جیهانی پێ ئەبەخشێ... بە مەرجێك کە ئەو گیانە ئەمرێنرێ و یەندی ئەکا لە دوو تۆی خــــراپەو تاوانبـاریدا .. ئەوەش بە پەیڕەوی ئەو بەرنامەیەی کە خوا ناردوویەتی بۆ ئادەمیزاد . کە بەرنامەی محمدی پێغەمبەرمان ـ ﷺ ـ دوا پەیام و بەرنامەی تەواویانە .. جا ئەو کەسانەی کە قەدری

---

(١) لە سورەتی «الحجر» دا ئەفەرموێ :

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ ﴿٢٨﴾

لِلْمَلَٰئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا

سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾

ئەو گیانەیان زانیوەو بەتاوان کردن دڵو گیانەکانیان ڕەش نەکردوەتەوە ، ئەوە ئەو گیانەیان کەوتۆتە جیهانێکی پڕ لە پاکیو بێگەردی خۆیەوەو شتی وای کردوە کە بە ( معجزه ) یا (ئەراسەتی موسلمان) وەیا ( کەشفـو کەراماتی ئەولیا ) ئەناسرێ .. کە جاروبار بەچاوی ئەو گیانە پاکەیان شتی زۆر دوورو نا دیاریان بە دی کـردوەو بە دەزگاکانی هەست ـ الحواس ـ دا زۆر شتی ناناسانیان لا ئاسان بووە .

دە فەرموو حەمزە گیان بزانم تۆش چیت بۆ وەرگرتوین ؟

حەمزە : دووەم دەرسی بەلای منـەوە ئەوەیە کە ئەنجامی فێڵو لووت بەرزی زۆر سەختو ناڵە بارە .. هەر هۆی فێڵو دەعیە بوو کە ئەیهێشت شەیتان لە بەهەشتدا بمێنێتەوە ... بەڵکو بووە مایەی ئەوە کە

لەعنەتی لێبکرێ ولە بەهەشت دەربکرێ (١) بۆیە هەموو کاتێك فێزو دەعیە و خود بەرســـتی ئەبێتە ریسوایی خاوەنەکەی لە هەردوو جیهـاندا .. بۆیە پێغەمبەری سەردارمان ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ : ئیمانو بروا بەخوا لەگەڵ زەرەیەك لە فێزو لووت بەرزیدا لەیەك دڵـدا کۆنابێتەوە ، وە دووبارە ئەفەرموێ : فێز وەرنەگرتنی حەقەو خەڵك بە سووك زانینە(٢).

مامۆسـتا : جوانە حەمزە گیان فێزو دەعیەبازی بەڵایەکی گەورەیە وتووشی هەر کەس بوو دەردەکەی شەیتـانی ئەبا بەدڵا . دە فەرموو دایکی ئوسـامە بزانم تۆ چیت بۆ دۆزیوەتەوە ؟

فاطمەخان : سێهەم دەرس لای من ئەوەیە کە خوای

(١) « قال فاهبط منها فما یکون لك أن تتکبر فیها فاخرج إنك من الصاغرین » . «الأعراف ١٣»

(٢) ریاض الصالحین ـ النووی ص٣٥٤ .

پەروەردگار دۆستەو پێغەمبەرێکی خۆی خستۆتە بەندیخانەی کوناهو سەرپێچییەوەتا ئادەمیزادەکان پەندی لێ وەربگرن ودوژمنایەتی شەیتانیان بۆ ئاشکرا بێ کە ئەوەندە بەکارو دەسەڵات دارە کە توانیویەتی باوە کەورەیان هەڵخەڵەتێنێ (١) .

دوژمنایەتی شەیتان راستیەکی مێژوویەو رووداوە ، وە پێویستی سەرشانی ئادەمیزادە کە بە دوژمنی بژمێرێ وە کەرەسەی جەنگی بۆ ئامادە بکا بۆ خۆیو دەزگاو بەچکە و شاکردەکانی کە هەمیشە لەپێستی دڵسۆزیو دۆستیدا خەریکی سوێند خواردنو پەیمان دانی کزیکارانەو کەڵەکچیانەن بۆ هەڵخەڵەتاندنی مەردووم .

مامۆستا : زۆرجوانە ، خوای پەروەردکار هەمیشە میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا .. ئادەی نەسیبە

---

(١) «یابَنِي آدمَ لا يَفتِنَنَّكُم الشيطان كما أخرج أبَوَيكم من الجنة» . [ الأعراف/٢٧ ]

گیان بزانم تۆ چیت بۆدۆزیوینەتەوە .. ؟

نەسیبە : چوارەم دەرسیش بەلای منەوە ئەوەیە

کە : هەر چەند گوناه گەورەو زۆربێ هێشتا رەحمو

سۆزو بەزەیی خوا زۆرو فراوانترە .. بۆیە پێویستە

لەسەر ئادەمیزاد کە تۆبەو پەشیمان بوونەوەی هەمیشە

لەسەر زمان بێ ، وە نابێ یاسو بێ هیوا بێ لە

رەحمەتی خوا ... وە ئەوەش ئەسەلێ بۆمان ، کە

هەڵەو تێ کەوتنو خەتا شتێکی نایابو دوور نیە لە

ئادەمیزادەوە ؛ بەڵکو پەشیمان نەبوونەوەو پشت گوێ

خستنی فەرمانی خوا شتێکی ناخۆشو نەفرین خوازە .

مامۆستا : زۆر جوانە رۆڵە گیان ، خوا مرۆڤی

وا دروست کردوە کە تاوان بکاو بە هۆی ئارەزوو

ونەفسیەوە هەڵبخەڵەتێ ، بەڵام ئەبێ پەشیمان بێتەوە ..

کەواتە تێ کەوتنەکەی گرنگ نیە ، بەڵکو گرنگ

پەشیمان بوونەوەکەیەتی .

چه دایکی ئوسامه ئەڵێی شتێکت بۆ چووه بیڵێی
فەرموو بیڵێ .

فاطمەخان : پێنجەم دەرس بەلای منەوه ئەوەیە که

حسابی نزیکی و دوری لای خوا وەچاکی و خراپی
بۆ خەڵك بەسراوه به ئەندازەی نزیکی و دوری ئەو
کەسەوه له پەیام و راوێژی خوا ، ئەوەی فەرمانبەری
خوا ناکا و نزیك له خوا نابێ هەمیشه دڵ پیس و
خراپەکاره . ئەوەش روو لەخوا بێ هەمیشه پاك و
پیاو چاکه ، ئەوەته قابیل خراپ و تاوانبار بوو چونکه
دوور بوو له خواوەو فەرمان و تەکبیرەکانی خوای
خستبوه پشت گوێ .. وه هابیل کورێکی باش و
بێ‌وەی و سەر بەچاکه بوو چونکه نزیك له خوا بوو
وفەرمان و تەکبیرەکانی خوای لەسەر سەر راگرتبوو ..

مامۆستا : بەڵێ ، خۆ خوای عالەمیان چی ئەوێ له

ئیمه جگه له چاکەو پیاوەتی ، بەلام خۆی دروستی کردوین‌و ئەزانێ بە چی وامان لێ دێت کە چاك بین ئەوەی بۆ رەوانه کردوین بە هۆی پێغەمبەرەکانەوە .
خۆیشم شەشەم دەرس بەوە ئەزانم کە ئارەزووەکانی جووتیەتی ونەمری وسامانداری وە تۆڕەکاری هەر لەسەرەتای ژیانی ئادەمیانەوە لەمرۆڤدا هەیەو بکرە لەگەل قورەکەی باوکە ئادەم دا شێلراوە ..
فەریزەی (جووتیەتی) ـ الزوجیة ـ واته هاوسەرگرتن یەکەم بناغەی ژیانی ئادەمیزادانەیە نەك تەنها بۆ بەجێ هێنانی ئارەزووی ( جنسی ) ، وە نەك تەنهـا لەبەر منداڵداری ونەوە خستنەوە .. بەڵکو خوای پەروەردگار وا رەنگی ئەم بوونەوەرەی رشتوە کە هەموو شتێك جووت بێ (١) ..

(١) « وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ » ، « الذاريات /٤٩ »

چونکە دامەرزاوی‌و خۆشی‌و ئارام لەوەدایە کە هەموو شتێك لەسەر ئەو بەرنامەو شێوەیە بروا کە خوا بۆی داناوە جگە لەمەش حورمەت‌و رێزێکی هێجگار زۆر بەدی ئەکەین لەم چیرۆکەدا بۆ ئافرەت کە دوای دروست بوونی دایکە حەوا لە گشت فەرموودەو فەرمانێکی خوادا لەگەل باوکە ئادەم ناوبراوە (۱) .

هەروەها غەریزەی ( نەمری‌و مانەوە ) ـ الخلود ـ ئەمەش جوان بە دیار ئەکەوێ لەسروشتەو ـ فطرة ـ ی باوکە ئادەم‌و نەوەکانیشیدا کە هەمیشە مرۆڤ حەزی لە مانەوەو نەمردنە .. بێ گومان ئەمە شتێکی خوایی‌یەو سوچی کەسی تیانیە .

ئەوە بوو دیمان کە بەو فێلە شەیتان توانی باوکە

(۱) «يا آدَمُ اسْكُنْ أنتَ وَزَوجُكَ الجَنَّةَ...»

ئادەم بخەڵەتێنێ کە پێی وت :

ئەتەوێ درەختی نەمریت پیشان بدەم ؟! (١) .

لە ڕاستیشدا ئەگەر ئەو مەراقە لەدڵی ئادەمیزاددا نەبێ هیچی بۆ ناکرێ و ناتوانێ هەڵسێ بە فرمانی خۆی .

هەروەها غەریزەی ( سامان و ماڵداری ). - التملك - ئەمیش لە سروشتی مرۆڤدا چاک ئاشکرایە کە هەمیشە حەز لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان ئەکات ..

---

(١) لە سورەتی « طـه » .

فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿﴾

وه هەمان ئارەزووبوو کە بوە مایەی ئەوە کە باوکە ئادەم فەرمانەکەی خوای لە یاد بچێ‌و لەدرەختەکە بخوا .. کە شەیتان وتی مولکی نەبراوەتان ئەبێ (١) .

ئەم ئارەزووەش هەر پێویستی بە بەهێز کردنی توانای مرۆڤە بۆ ئاوەدان کردنەوەی کشت سەرزەوی .

وە هەروەها غەریزەی ( ئایینداری‌و تۆبەکاری ) ـ التدین ـ ئەم ئارەزووەش لە مرۆڤدا بنجی داکوتاوەو زۆر جار ئەکەوێتە مەیدانی کارەوەو هێندێ جاریش ئارەزووەکانی تر ئەبکەن بەژێرەوە ..

وە بە زۆری لە دوو کاندا دەرئەکەوێ :

یەکەم : لەکاتی تەنگانەدا کە مرۆڤ ئەپاڕێتەوە

---

(١) « هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَا يَبْلَى ؟ » « طه »

وداوای رەحمو سۆزو بەزەیی لەخوائەکا ، دوایش.
کە رزگاری‌بوو پەشیمان ئەبێتەوەو ئەچێتەوە دۆخی
جارانی ..

دووەم : لەکاتی روداوی گوناهو خراپەیەکدا لە دەست
مرۆڤێکی باش ...

کاتێك کە ئارەزووەکانی تر فرسەتی لێ‌دێنن و
خراپەیەك ئەکا .. ئینجا بە پەلەپەشیمان ئەبێتەوەو تۆبە
ئەکا ؛ وەك لەم چیرۆکەدا پەشیمانی باوك و دایکە
گەورەمان بۆدەر ئەکەوێ .

ئوسامە : بە خوا دەرسی جوانمان خوێند بابەگیان ...

بە راستی مرۆڤ ئەو پایەو پلە بەرزەی خۆی لەیاد
ئەچێ‌و فەرمانی خواو جێگەداری خواپشت گوێ ئەخاو
فێزو لوت بەرزی ئەکاو ئاکای لەدوژمنایەتی شەیتان.
وەزگاکەی بێ‌و شوێن بەرنامەو پرۆگرامی خـــوا

بکەوێ ؛ هەمیشە سەر بەرزو ڕوسوری لای خواو
لای مەردوم ئەبێ وە خۆی تەنها بە بەرپرسیاری
خوا ئەزانێ .. ئەم بیرە قول و فەلسەفە جوانە لە کوێ و
ئەو داستانە درۆییانە لە کوێ کە دەمێ مرۆڤ
ئەکەن بە بەچکەی کرم و جانەوەرو ، دەمێ ئەیکەن
بە ڕۆڵەی مەیمون ؟ .. جا تو خوا ئەگەر
ـ خوانەخواستە ـ باوە گەورەمان کرم وەمەیمون
بوایە ، چۆن ئەمانوێرا لە هاوڕێ جانەوەرانیشا
بلێین « لەل » . دیارە مەبەست ئەم شەیتانۆلکە
درۆچیانە تەنها ئەوەیە کە لە ڕێزی مرۆڤ کەم
بکەنەوەو بیخەنە بەرشەپۆلی نۆکەری خۆیانو شەیتانی
ئاغایان ..

لە کۆتاییەدا : بە ناوی هەموانەوە ڕێزو سوپاست
پێشکەش دەکەم ئەی بلوکی بەڕێز ، وە لە خوا

ئەپارێمەوە کە ئزمان بۆ خۆشکا ؛ بۆ کەرم کردنەوەی
گیانو هەستو هۆشمان بە زۆپای چیژۆکە
قورئانیەکانت .. کە خوا ئەزانێ هەرکەسێك فریای
ئەم جۆرە زۆپایانە نەکەوێ لەم دەشتو دەرو کێوو
چیایانەدا ڕەق ئەبێتەوەو ئەبێ بەشەهیدی ڕێگای
کێلیەتیو بێ کەس ..

حەمزە : بەڵام ئەبێ دلمان خۆش بکەی بەوەی کە
ئایا نیازت وایە بمان حەوێنیتەوە لە سایەی چیژۆکی
تری قورئاندا ... ؟!

مامۆستا ڕەحیم : خوا بکا ئێوەم بۆ خۆش بێـو
ئەمەنمان وەفا بکا نیازم وایە ـ خوا کۆمەك بێ ـ
لەم زستانە پڕ لەسەرماو سۆڵەیەدا ، ئەم چیژۆکە
قورئانیانە بکەینە شەو چەرەمان تا خوا بەهارمان
بۆ دێنێ ، ئەوسا لەسایەی لقێکی تری قورئاندا

ئەحەسێنەوە .. کە واتە تا چێژکی داماتوو خواتان لەگەڵ ...

« سُبحانَ ربِّكَ ربِّ العزة عمّا يصفون وسلامٌ على المرسلين والحمد لله ربِّ العالمين » .

## بەم زوانە

چاوەڕوانی ئەلقەی دووەمی ئەم زنجیرەیە بکەن
( نوح پێغەمبەر ) درودی خوای لەسەربێ .

# سەرچاوەکانی ئەم نامیلکەیە

| | |
|---|---|
| (١) تەفسیری ابن کثیر | الحافظ إبن کثیر |
| (٢) في ظلال القرآن | سید قطب |
| (٣) نور الیقین | محمد الخضري بك |
| (٤) ارشاد الساري لشرح صحیح البخاري | للعلامة القسطلاني |
| (٥) قصص الانبیاء | عبد الوهاب النجار |
| (٦) مع الانبیاء في القرآن الکریم | عفیف طبارة |
| (٧) آدم ﷺ | بهي الخولي |
| (٨) النبوة والانبیاء | علي الندوي |
| (٩) فقه السنة | سید سابق |

